## پەرتووکی

# زەکــــات

**شەرحی (مەتن)ی (غاية التقريب)**

**ناسراو بە (فتح القريب)**


نووسینی

**مەلا محمود گەڵاڵی**

سۆران



**أربيل _ كوردستان**

| | | |
|---|---|---|
| ١٤٤١ھ | ٢٧٢٠ك | ٢٠٢٠م |

## كتاب الزكاة

# پەرتوكی زەكات

**الحمد لله العلي الكبير العظيم القدير والصلاة والسلام على البشير النذير وعلى آله وصحبه أجمعين أما بعد:**

**بەرێزان :**

**بێگومان زەكات روكنی سیٚ یەمی ئایینی ئیسلامە،وە بە قورئان وفەرموودە وئیجماعی زانایان فەرزی عەینە لەسەر هەر موسلمانێك كە خاوەنی مال و سامان بێت بەو مەرجانەی كە لە مەودوا باسیان دەكەین.**

**بەڵگەی واجب بوونی زەكات لە قورئان: ﴿ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ﴾ .(43)البقرة . واتە: نوێژەكانتان بەتەواوی بكەن و زەكات بدەن وە لەگەل نوێژخوێنان نوێژ بكەن .**

**بەلگەی واجب بوونی زەكات لە فەرموودەی پێغەمبەرمان: «بُنِـيَ الإسْلامُ عَلَـى خمْسٍ: شَهَادَةِ أنْ لا إلَـهَ إلا اللهُ وَأنَّ مُـحَمَّداً رَسُولُ الله وَإقَامِ الصَّلاةِ، وَإيتَاءِ الزَّكَاةِ، والـحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ». متفق عليه[1].**

**واتە: ئایینی ئیسلام لەسەر پێنج پایە بونیات نراوە: شایەتمانی كە هیچ خودایەك نیە جگە لە زاتی الله ،وە موحەممەد نێردراوی خودایە ،وە ئەنجامدانی**

---

(١) **متفق عليه**، أخرجه البخاري برقم (٨)، واللفظ له، ومسلم برقم (١٦).

نوێژ، وە زەکات دان ، وەحەج کردن ، وە بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزان .

هەروەها پێغەمبەرمان کە مەعازی کوری جەبەلی رەوانەی یەمەن کرد ،پێی فەرموو : («ادْعُهُمْ إِلَى: شَهَادَةِ أنْ لا إِلَهَ إلا اللهُ وَأنِّي رَسُولُ الله، فَإِنْ هُمْ أطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأعْلِمْهُمْ أنَّ اللهَ قَدِ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأعْلِمْهُمْ أنَّ اللهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أمْوَالِهِم، تُؤْخَذُ مِنْ أغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِم»). متفق عليه[1].

بانگیان بکە بۆ شایەتمانی دان بەدل و زمان : کە هیچ خودایەك نییە جگە لە زاتی الله ،وە من رەوانەکراوی خودام، ئەگەر بەگوێیان کردی و پابەندبوون، ئەوا فێریان بکە و پێیان رابگەیەنە کە خودا لە شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوونە، ئەگەر بەگوێیان کردی و پابەندبوون، ئەوا فێریان بکە و پێیان رابگەیەنە کە خودا لە مال و سامانیان سەدەقەیەکی (مەبەستی زەکاتە) لە سەر فەرز کردوونە، لە دەولەمەندەکانیان وەردەگیرێتو دەدرێت بە هەژارەکانیان.

(١) **متفق عليه**، أخرجه البخاري برقم (١٣٩٥)، واللفظ له، ومسلم برقم (١٩).

## زەكات نەدان

زەكات نەدان لە گوناهە گەورەكانە، ئەگەر زەكات نەدەر باوەری نەبێت بە واجبی زەكات ئەوە كافر دەبێت بە ئیجماعی زانیان. بەلام ئەگەر هەر لەبەر تەمبەڵی و رەزیلی بێت كافر نابێت حاكمی موسلمانان بە زۆر زەكاتی لێدەستێنی بۆ ئەهلی زەكات.

## پێناسەی زەكات

لەزمانی عەرەبی زەكات بە مانای گەشەكردن وبەرەكەت وپاك بوونەوە دێت. وەلەشەریعەتی ئیسلام بریتی یە:لەدەركردنی ئەندازەیەكی دیاری كراو،لە مال وسامانی دیاری كراو،بۆكەسانی دیاری كراو،كەشەرع دیاریكردوونە بەنیەتی خودا پەرستی .

– وەبۆیە ناوی نراوە زەكات چونكە مالەكە پاك دەكاتەوە ،وە دلی خاوەنەكیشی پاك دەكاتەوە لە ژەنگی رەزیلی و خۆش ویستنی مال و سامان ،وە دلی هەژارانیش پاك دەكاتەوە لە رق و قینە لە دەولەمەندان.

وەك لەم ئایەتە پیرۆزە خودا فەرمان دەكات بە پێغەمبەرمان : (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا ) (١٠٣) التوبة. واتە :ئەی پێغەمبەری خۆشەویست : لە مال وسامانی ئیمانداران زەكات وەربگرە بۆ ئەوەی مالەكانیان پاك بكەیتەوە و خۆشیان پاك بكەیتەوە لە پیسی رەزیلی پارەپەرستی . وە پێغەمبەری خوداش فەرموویەتی: (ما نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِن مالٍ، ) رواه مسلم ٢٥٨٨. واتە: بەهیچ چەشنێك سەدەقە وخێر مال و سامان كەم ناكاتەوە .

# كاتی واجب بوونی زەكات

١–زەكات لەسەرەتای ئیسلامەتی لە شاری مەككە واجب كرا ،بە شێوەكی گشتی ، نە ئەو شتانە دیاری كرابوون كە زەكاتی لێبدەن ،وە نە ئەو ئەندازە دیار كرابوو كە بیدەن بە هەژاران ، موسلمان بە گوێرەی قەناعەت و دەسەلاتی خۆی هەر مال و سامانێكی خودا پێیدابوو لێی دەبەخشی و خێر و سەدەقەی دەكرد ،وەك لەم ئایەتە خوا باسی سیفەتە جوانەكانی ئیماندارا دەكات دەفەرموێ:

(وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ ، لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ) (**المعارج:٢٤– ٢٥**).

واتە: ئەو بروادارانەی لە مالەكانیان مافێكی زانراو هەیە ، بۆ كەسانی لە بەر پێویستی سوال دەكەن و بۆ نەداران .

٢–تا سالی دووەمی هیجرەت لە مانگی (شەعبان ) یان (شەووال) ئەوكاتە حوكمەكانی زەكات بە روونی بۆ موسلمانان دیاری كرا ، ئەو شتانە دیاری كرا كە زەكاتیان لێدەكەوێت ، لەگەل بری زەكاتەكە ، و ئەوانەی شایستەی زەكاتن .

٣–وە لەسالی نۆی هیجری پێغەمبەر ﷺبۆ یەكەم جار فەرمانبەری تایبەتی نارد بۆ كۆكردنەوەی زەكات، سندوقی زەكاتی دانا وەك سیستەمێك بۆ دەولەتی ئیسلامی ،دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە :

ا–( خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا ) (١٠٣) **التوبة.**

واتە : زەكاتێكیان لیٚ وەربگرە لە مال و سامانەكانیان كە مالەكەیان پاك بكاتەوە وە دل ودەرونیشیان لە رەزیلی و خۆشەویستی مال وسامان .

ب– (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حكيم) التوبة ٦٠.

واتە: بەراستی زەکاتەکان تایبەتە و مولکی نەداران و هەژاران و فەرمانبەرانی کۆکەرەوەی زەکات و ئەو موسلمانانەی دلیان رادەگیریٚ بۆ بەهێز بوونی ئیسلامەتیان و ئەوکۆیلانەی دەیانەویٚ ئازادبن و قەرزداران و موجاهیدانی خۆبەخش وریٚبوار انە .

بەرێزان: لەم نامیلکە ، پوختەیەکی جوانی حوکمەکانی زەکات لە ئیسلامدا روون دەکەینەوە، بەچەشنێك هەموو خەلك بتوانیٚ سوودی لێوەربگرێت.وە هەنگاوێك بێت بۆ ئاسانکردنی فیقهی ئیسلامی، وە برەودانیش  بێت بە مەزهەبی ئیمامی شافعی رەحمەتی خوای لێبێت .

هەروەها لەسەر داوای هەندێك لە مامۆستاو قوتابیانی زانستە شەرعیەکان ،کەمێك ئاماژە بەرای جیاوازی زانایان دەکەین  بە مەبەستی دەولەمەند کردنی بابەتەکە و ئاشنابوونی خوێنەران ،بە بۆچونی زانایان .

تا رادەیەك گرنگی بە بەلگەی بابەتەکان دەدەین، وە ئاماژە بە سەر چاوەی دروست بوونی رای جیاواز دەکەین .

**دەستپێك:**

**بەرێزان: لە پێناو ئاسانکردنی بابەتەکە، بۆ ئەوەی خوێنەر بەئاسانی بگاتە مەبەست، بە چاکم زانی هەندێك روونکردنەوە بۆ زاراوە سەرەکیەکانی بابەتی زەکات بە تایبەتی مەرجە گشتییەکانی واجب بوونی زەکات روون بکەمەوە .**

**مەرجە گشتیەکانی واجب بوونی زەکات بریتییە لە :**

## مەرجی یەکەم ئیسلامەتی

**زەکات لە ماڵی کافر واجب نییە ،چونکە زەکات عیبادەتە ،لەکەسی بێباوەر نایەتە دی .**
**بەلام کەسی هەلگەراوە لە ئیسلام (مرتد) ئەگەر پەشیمان بۆوە لە کوفرەکەی هاتەوە ناو ئیسلامەتی ،دەبێت زەکاتی سالانی رابردوو بدات .**
**تێبینی : لەلای هەندێك لەزانایان بەتایبەتی حەنەفیەکان پێویستە خاوەن ماڵ (عاقل و بالغ) بێت ئەو کاتە زەکات لەماڵەکەی فەرز دەبێت واتە شێت و منداڵ بەلای ئەوان زەکاتیان لەسەر نیە هەرچەند دەوڵەمەندبن....**
**بەلام بەلای زۆربەی زانایان(مالیك و شافعی و ئەحمەد) زەکات لەماڵ و سامانی مندال و شێت واجبە چونکە زەکات عیبادەتێکی مالی یە پەیوەندی بە ماڵ و سامان هەیە نەك بە عەقل و بلوغ، واجبە لەسەر ئەو کەسەی (وەلی) یانە سەرپەرشتیان دەکات هەڵبستێت بە دەرکردنی زەکات لەماڵی منداڵ و شێت....وەبەلگەی جمهور بەهێز ترە هەروەك ئیمامی عومەریش فەرموویەتی :**
**(اتجروا بأموال اليتامى لا تأكلها الزكاة ) رواه الدارقطني والبيهقي وقال : إسناده صحيح.**

واتە : بازرگانی بە سامانی بیٚ باوکان بکەن ، با زەکات نەیخوات .
**تیٚبینی: بەلای (حەنەفیەکان) زەکات لە سامانی رووەك و ئاژەلٌی مندالٌ و شیٚت واجبە ئەم مەرجە تەنها بۆ ئالٌتون و زیوو پارەیە لەلایان .**

## مەرجی دووەم ( ئازادی )

**واتە کۆیلە نەبیٚت ، چونکە کۆیلە خۆیی و هەرچی هەبیٚت مولکی خاوەنەکەیەتی .**

## مەرجی سیٚیەم مالەکە گەیشت بیٚت بە ( نیصاب )

**نیساب ژمارەیەکە یان پیٚوانەیەکە ،ئەندازەیەکە شەرع دیاری کردووە، بۆ گەیشتن بە واجب بوونی زەکات ، لە ئاژەلان ئەگەر لەو ژمارەیە کەمتر بیٚت زەکاتی لیٚناکەویٚت ،وە لە پارەو زیٚر و زیو بە ژمارەو کیٚشە(وزن) ،وە لە میوەو دانەویٚلە بە پیٚوانەیە .**

### رونکردنەوە:

## نیسابی ئاژەل

**أ–نیسابی حوشتر بۆ زەکات لیٚ واجب بون پیٚنج دانەیە ،لە پیٚنج حوشتر کەمتر زەکات نییە .**

**ب– نیصابی مەروو بزن بۆ زەکات لیٚ واجب بوون ٤٠ سەرە ،لە ٣٩ سەر زەکات واجب نییە .**

**ج– نیسابی رەشە ولاغ بۆ واجب بونی زەکات ٣٠ە سەرە ، لە ٢٩ سەر زەکات واجب نییە.**

## نیسابی زێر و زیو

نیسابی زێر بۆ زەکات لیٚ واجب بوون ٢٠ میسقالی شەرعیە کە دەکاتە ٨٥ گرام بە کێشی ئەمرۆ،کەمتر لەم ئەندازە زەکات واجب نیە .

میسقالی شەرعی بە کێشی ئەمرۆ دەکاتە (٤،٢٥ گرام) بۆیە ٢٠ میسقالی شەرعی کەمتر لە ١٥ میسقالی بازاری ئەمرۆیە . وە نیسابی زیو بۆ زەکات لیٚ واجب بوون ٢٠٠ درهەمی زیوە دەکاتە ٥٩٥ گرام ،وە ١٤٠ میسقال زیو ، ئەگەر لەم ئەندازە کەمتر بوو زەکاتی لیٚ واجب نیە .

## نیسابی رووەك

نیسابی دانەوێلە و میوە بۆ زەکات لیٚ واجب بوون، پێنج ویسقە ،کە دەکاتە ١٦٠٠ ریتل بەپێوانەی کۆن ،وە بەکێشی ئەمرۆ نزیکەی ٦٥٠ تا ٧٠٠کیلۆگرامە ،وەبە پێوانەی کۆنی کوردەواری ٤٠ تەنەکەی گەورەی ١٦ کیلۆیی بوو .

ئەگەر بری داهاتەکە لەوە کەمتر بوو زەکاتی لیٚ واجب نابێت .

بە مەرج گرتنی نیساب بۆ زەکات واجب بوون ،بە گوێرەی فەرموودەکانی پێغەمبەرمان بووە ،وەك لەم فەرموودە هاتووە: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أوْسُقٍ صَدَقَةٌ». متفق عليه[١].

واتە:لە زێر لەکەمتر لە پێنج ئۆقیە زەکاتی تێدا نییە (ئۆقیە چوار دیناری زێر بووە)، وەلە کەمتر لە پێنج حوشتر زەکاتی تێدا نییە ،وە لە دانەوێلە و میوە لە کەمتر لە پێنج ویسق زەکاتی تێدا نییە.

(١) **متفق عليه**، أخرجه البخاري برقم (١٤٠٥)، واللفظ له، ومسلم برقم (٩٧٩).

## مەرجی چوارەم : مولكی تەواوی خاوەنی بێت

واتە مالەكە بە شێوەیەكی شەرعی مولكی كەسێكی یان كەسانێكی دیاری كراوبن ،وە مالەكە لەژێر بەرێوەبردن وتەسەروفی خاوەنی شەرعی خۆی بێت .

كەواتە مالی دزراو، داگیر كراو، دەبێت بدرێتەوە خاوەنی شەرعی خۆیان و خاوەنیان زەكاتەكەی بدات .

تێبینی: لێرە چەند مەسەلەیەك دێتە پێش بە گوێرەی پوختەی مەزهەبەكان روونی دەكەینەوە :

جا لێرە مەسەلەی قەرز دەر (الدائن) و قەرز دار (المدین) دێتە پێشەوە كە چۆن زەكات لە سامانی خۆیان دەردەكەن ئایا لەم حاڵەتە خاوەنی ماڵن یان نا؟ وە ئەو پارەیەی قەرز دەر داویەتی بە خەلك و ئێستا لای خەلكە ئایا مولكی تەواوی خۆیەتی زەكاتی لێدەردەكات؟ وە قەرزدار ئەو پارەیەی لە خەلك بە قەرز وەریگرتووە ئایا بووە بە مولكی تەواوی خۆی ، واجبە زەكاتی لێ بدات؟

## وەلامی ئەم پرسیارانە بەم چەشنەیە

١-زەكاتی ماڵی قەرز دەر (خاوەن قەرز،الدائن)

مەبەستمان پێ ئەو كەسەیە كە ماڵی خۆی داوە بە قەرز ئایا لەو پارەیەی بە قەرز لەلای خەلكە زەكات دەدات یان نا؟ وە بۆچی؟

لەم مەسەلەدا زانایان چەند رایان هەیە:

**ا-مەزهەبی ئیمام مالك:** زەكات لەو مالە ناكەوێت تا خاوەنی وەری دەگرێتەوە ،كاتێك وەری گرتەوە ئەگەر چەند سالیش بەسەردا سورابێتەوە ئەوە تەنها واجبە زەكاتی یەك سالْ دەربكات...تەنها ئەوە نەبێت ئەگەر قەرز دەر بازرگان بوو ئەوە هەر كاتێك مەرجەكانی واجب بوونی زەكاتی لێ هاتەدی دەبێت زەكات بۆ هەموو سالێك بدات لە كاتی خۆیی دا.

**ب: مەزهەبی ئیمامی شافعی:**

**١-ئەگەر قەرزەکە لەلای کەسێکی حال خۆش بوو ئامادە بوو پارەکە بداتەوە هەرکاتێك داوای لێ بکرێت، ئەوا واجبە زەکاتەکەی دەم و دەست لێ بدات..**

**٢-ئەگەر پارەکە لەلای یەکێك بوو نکولی لێ دەکرد بەلاَم دەتواندارا بە دادگا لێ وەربگرێت نەوە دیسان دەبێت زەکات بدات هەر کاتێك سالێ بەسەر مالەکە سوراوە...**

**بەلاَم ئەگەر قەرزەکە لەم دوو حالەتە نەبوو کە باسمان کرد واتە:_**

**١-پارەکە لای یەکێك بوو زۆر هەژار بوو نەیدەتوانی بیداتەوە .**

**٢-یان لای یەکێك بوو ئینکاری لێ دەکرد و لەرێگای دادگاش نەدەتواندرا لێ ی وەربگرێتەوە ..جا لەبەر ئەوە شاهێد و بەلگەی نەبوو یان لەبەر هەر هۆیەکی تر...ئەوا لەم دوو حالەتە زەکات واجب نابێت هەتا پارەکەی وەردەگرێتەوە کە وەری گرتەوە چەند سالی بەسەردا سورا بۆوە واجبە زەکاتی هەموو سالەکان بدات...**

**تێبینی:بەلای مەزهەبی شافعی ئەگەر ئەو مالەی بەقەرز درابوو ئاژەلێ بوو ((مەر و بزن و مانگا و گا و گامێش و حوشتر))ئەوە زەکاتی لێ ناکەوێت چونکە لە مەرجەکانی واجب بوونی زەکات لە ئاژەلێ بەلای ئەو لەوەرانە لە مولکی خاوەنی ئەوەش نەهاتۆتەدی...**

**بەلای مەزهەبی شافعی وەك یاسایەك: قەرز رێگری لە واجب بوونی زەکات ناکات. هەروەك لە مەتنی (عمدة السالك )هاتووە : (لو ملك نصاباً فقط وعليه من الدين مثله، لزمه زكاة ما بيده، والدين لا يمنع الوجوب).**

**ج)مەزهەبی ئیمام (ئەحمەد): ئەگەر مالەکە لەلای کەسێکی حالێ خۆش بوو ئامادە بوو هەرکاتێك داوای لێ بکرێت بیدا هەرکاتێك وەری گرتەوە زەکاتەکە دەر دەکات جاسالێك بێت یان زیاتر هەمووان دەدات،بەلاَم ئەگەر بەپێچەوانەی ئەمەی**

سەرەوە بوو لەسەر فەرموودەی راست ئەوە زەكات واجب نابێت،وە مەزهەبی ئیمام حەنەفی لەم مەسەلەدا نزیكە لە مەزهەبی ئیمام ئەحمەد.....

## زەكاتی مارەیی ئافرەت

لەبەر ئەوەی مارەیی ئافرەت لەلای مێردەكەی بەقەرز دەمێنێت بەپێویستم زانی لێرەدا باسی بكەم،لەم مەسەلەدا دوو فەرموودەی مەشهور هەیە لەلایەن زانایاندا....

١-بەلای ئیمامی حەنەفی و ئیمامی مالك زەكاتی لێ ناكەوێت هەتا لە مێردەكەی وەردەگرێتەوە كە وەری گرتەوە ئەگەر گەیشتبووە ئەندازەی زەكات لێ واجب بوون كە بیست (٢٠) میسقال زێرە لەو رۆژەوە كە وەری گرتەوە كەساڵی بەسەردا سورایەوە تەنها زەكاتی ئەم ساڵی لێ دەردەكات....

٢-بەلای ئیمامی شافعی ئەگەر مارەیی یەكە گەیشبووە ئەندازەی زەكات ئەوا هەركاتێك وەریگرت لە مێردەكەی ،دەبێت زەكاتی هەموو ساڵەكانی لێ دەربكات كە لەلای مێردەكەی بووە وە مەزهەبی ئیمام ئەحمەدیش لەسەر ئەم رایەن...

## زەكاتی مالی وەقفكراو

مالی وەقفكراو بۆ خێر وسەدەقەی گشتی زەكاتی لێناكەوێت چونكە خاوەنی دیاریكراوی نییە ،بەلام ئەگەر مالەكە وەقفكرابوو لەسەر كەسێك یان چەند كەسێكی دیاریكراو ئەوە هەركات مەرجەكانی زەكاتی لێهاتەدی دەبێت زەكاتەكەی بدرێت .

لەمەزهەبی شافعی ئەگەر مالی مزگەوت وقف كرابێت لەسەر ئیمامی مزگەوت (ئەو

كەسەی پێشنوێژ دەكات) رای بەهێز وەقفەكە زەكاتی لێناكەوێت .

هەروەها داهاتی رێخراوەكانی خێر خوازی زەكاتی لێناكەوێت چونكە خاوەنی دیاری كراوی نییە .

## بەرخستنی قەرز لە جیاتی زەكات

ئەگەر كەسێك قەرزی لەسەر كەسێك بێت ، زۆر هەژار بێت ،نەتوانی بداتەوە ،ئایا دروستە خاوە مال بە هەژارە قەرز دارەكە بلێت ،ئەو ئەندازە قەرزەت لێخۆشبووم وەك زەكات ؟

بەلای جمهوری زانایان جائیز نیە وەكارێكی شەرعی نییە ،وە هەندێك جائیزیان كردووە بە مەرجێك خاوەن قەرز پارەی دابیت بەهەژارەكە نەك كەل وپەلی بازرگانی .

وە ئیمام نەوەوی رای بەهێز لە مەزهەبی شافعی فەرموویەتی یە : دروست نیە .

## مەرجی پێنجەم: سال سورانەوە بەسەر مال وسامانەكە

**سورانەوی ساڵ**

واتە ساڵێ یەك جار زەكات واجبە وە ئەو شتەی زەكاتی لێ دەدەین دەبێت بە درێژای ساڵێكی مانگی (السنة القمرية) هەبوو بێت ئینجا زەكاتی لێ واجبە..

هەروەك لە فەرمودەی پێغەمبەرمان ﷺهاتووە :«لا زكاة في مال حتى يحول عليه الحول». رواه الترمذي

واتە:هیچ زەكاتێكی واجب نیە لە مال و سەروەت تا سالی بەسەردا دەسورێتەوە، وە بەیهەقی دەلێ :خەلیفەكان و هاوەلان بەم چەشنە زەكاتیان جێبەجێ كردووە .(لا٩٥ ج ٤) .

كە مەبەستی :(زێر و زیو و پارە و ئاژەل و مالی تیجارەتە ) .

بەلام رووەك (میوە و دانەوێڵە) ،زەكاتی كان (المعادن) وە دەرهێنانی زێر و زیوی شاراوەی پێش ئیسلام (ركان) پێویست بەو مەرجە ناكات هەركاتێك بەرهەمەكە هاتە دەست یەكسەر واجبە زەكاتی لێ دەربكرێت ، پێویست بەسال سورانەوە ناكات .

تێبینی: رووەك (میوە و دانەوێڵە) كە زەكاتی لێ دەركرا ،با چەند سالی تریش لای خاوەنی بمێنێتەوە پێویست بە دووبارە بونەوەی زەكات لێدان نیە ،بۆ نمونە پیاوێك هەزار تەنەكە گەنمی دەست كەوت لەكاتی دورێنەدا زەكاتی دەركرد ئەگەر چەند سالێك ئەو بەرهەمە هە رلەلای مایەوە پێویست بە دووبارە بوونەوەی زەكات دان ناكات بە گوێرەی ئایەتی :(كُلُواْ مِن ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ) واتە: لە میوەو بەرهەمەكەی بخۆن و مافی هەژارانی لێ بدەن لە رۆژی دورێنەدا ،وە زیادەرەوی و ئیسراف مەكەن چونكە خودا خەلكی موسریفی خۆش ناوێت.

## سال سورانەوە كەی دەست پێ دەكات لە زەكات

بەرێزان: ئەو شتانەی كەلەسەرەوە گوتمان بە مەرجی سال لەسەر سورانەوە زەكاتیان لێ واجب دەبێت: (زێر و زیو و پارە) لەگەل ( مالی بازرگانی) لەگەل (ئاژەل: حوشترو گاو مانگا و گامێش و مەر و بزن) .

وە ئەوانە لەو رۆژەوە سالیان بۆ حیساب دەكرێت ئەگەر گەیشتنە نیساب ، وەهەر كاتێك نیسابیان كەمتر بوونەوە ، سالیان دەپچرێت ، بۆ نموونە : كەسێك ٢٩ سەر مانگای هەبوو،ەپێنج مانگ لەلای بوو، لەمانگی شەشەم دانەیەكی تری كری بوون بە ٣٠ سەر، لەرۆژی بوونە ٣٠ سەر، سەرەتای سال دەست پێ دەكات.

نموونەیەكە تر پیاوێك ٤٠ سەر مەری هەبوو لەمانگی یەك بەردەوام لای بوو تا

مانگی  حەوت ، دانەیەکی فرۆشت یان مرد ،مادەم لە نیساب کەمتر بوو سالەکەی دەپچرێت ،لە مانگی هەشت دانەیەکی کری بوونەوە ٤٠ ئەوە لەو رۆژەی بوونەوە ٤٠ سالی زەکاتیان سەر لە نویٚ دەست پیٚ دەکات .

تێبینی : تەنها مالی بازرگانی مەرج نییە نیساب بە درێژایی سال بوونی هەبێت ،گرنگ ئەوەیە کۆتایی سال گەیشتە نیساب زەکاتی واجبە .

## پوختەی شەرحی مەتنی

## ( ابو شجاع – كتاب الزكاة )

## ناسراو بە فەتح والقريب

## الأموال التي تجب فيها الزكاة

## ( ئەو شتانەی زەكاتیان تێدا واجبە )

تجب الزكاة في خمسة أشياء وهي: المواشي والأثمان والزروع والثمار وعروض التجارة.

زەكات لەپێنج شت واجب دەبێت: ئاژەل، پارەو پول، دانەوێلە، میوە، كەل وپەلی بازرگانی.

## المواشي

## ( ئاژەل )

فأما المواشي فتجب الزكاة في ثلاثة أجناس منها وهي: الإبل والبقر والغنم. وشرائط وجوبها ستة أشياء: الإسلام والحرية والملك التام والنصاب والحول والسوم.

له ئاژەلاندا زەكات تەنها لەسێ رەگەز واجب دەبێت : حوشتر ،رەشە ولاغ ، مەر و بزن . وە مەرجەكانی واجب بوونی زەكاتیش لەم سێ رەگەزە ، شەش شتە: موسلمان بوون ، ئازادی ، مولكایەتی تەواو ، گەیشت بێتە نیساب ، سورانەوەی سال ، لەوەران لە پاوانی حەلال .

ئاژەل جگە لە مەرجە گشتییەكان مەرجێكی تایبەتی هەیە بۆ واجب بونی زەكات ،ئەویش لەوەرانە لەپاوەنی حەلال كە بەبێ مەسرەف زۆربەی سالەكە بە خێو

كرابێت ،بەلام ئەگەر شەش مانگ زیاتر بە عەلەف و كاو جۆ بە خێو كرا زەكاتی لێناكەویت.

## الأثمان

## – نەخت – زێر و زیو و پارە

وأما الأثمان فشيئان: الذهب والفضة .وشرائط وجوب الزكاة فيها خمسة أشياء: الإسلام والحرية والملك التام والنصاب والحول.

هەروەها نەخت (زێرو زیو ) ،زەكاتیان لیٚ واجبە ، وە مەرجەكانی واجب بوونی زەكات تێیاندا : پێنج شتە : موسلمان بوون ، ئازادی ، مولكایەتی تەواو ، گەیشت بێتە نیساب ، سورانەوەی سال ،

## الزروع

## دانەوێلە

وأما الزروع فتجب الزكاة فيها بثلاثة شرائط: أن يكون مما يزرعه الآدميون. وأن يكون قوتا مدخرا. وأن يكون نصابا وهو" :خمسة أوسق لا قشر عليها."

وە بەلام دانەوێلە بەسیٚ مەرج زەكاتی تێدا واجب دەبێت : لەو شتانە بێت كە ئادەمیزاد دەیانرۆینن (دەیان چەقێنن –سروشتی نەبن) ،وە لە خۆراكە سەرەكیەكان بێت وبتواندرێت هەلبگیرێت ، وە بگاتە نیساب : كە دەكاتە پێنج ویسق ،كەپاك بێت لەپەلك و كاو چەلتوك .

## الثمار

## میوە

وأما الثمار فتجب الزكاة في شيئين منها: ثمرة النخل. وثمرة الكرم. وشرائط وجوب الزكاة فيها أربعة أشياء: الإسلام والحرية والملك التام والنصاب.

وە بەلام میوە زەکات تەنها لە دوو شتیان واجبە : بەرهەمی داری خوورما، و بەرهەمی داری مێو ، وە مەرجەکانی واجب بوونی زەکات تێیاندا : چوار شتە : موسلمان بوون ، ئازادی ، مولکایەتی تەواو ، گەیشت بێتە نیساب .

بەرێزان: بەلای مەزهەبی حەنەفی زەکات لەهەموو میوەکان دەکەوێت لە نرخەکەیان .

## عروض التجارة

## مالی بازرگانی

وأما عروض التجارة فتجب الزكاة فيها بالشرائط المذكورة في الأثمان.

وەهەروەها ،مالی بازرگانی بەهەمان مەرجەکانی زێر و زیو کەباسکرا زەکاتی لێ واجب دەبێت .

## زەکاتی ئاژەڵ

ئیمامی شافعی و جمهوری زانایان له زەکاتی ئاژەڵ پشتیان به نوسراوی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بەستووه .کە ئیمامی ئەبو بەکر لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کاری پێ کردووه وه بوخاری له صحیحی خۆی نەقلی کردووه فەرموودەی ژمار ه (١٤٥٤) وه هەروەها (نەوەوی) و ابن حەزم و ابن تیمیه و شەوکانی زۆر جەختیان لە راستی و بەهێزی فەرمودەکه کردووه ،بەلام مەزهەبی حەنەفی کاری بە فەرمودەی تر کردووه بۆیه ،لە هەندێك شت رای جیاواز هەیه .

### زكاة الإبل

## زەکاتی حوشتر

وأول نصاب الإبل خمسة وفيها شاة وفي عشر شاتان وفي خمسة عشر ثلاث شياه وفي عشرين أربع شياه وفي خمس وعشرين بنت مخاص وفي ست وثلاثين بنت لبون وفي ست وأربعين حقة وفي إحدى وستين جذعة وفي ست وسبعين بنتا لبون وفي إحدى وتسعين حقتان وفي مائة وإحدى وعشرين ثلاث بنات لبون ثم في كل أربعين بنت لبون وفي كل خمسين حقة.

### زەکاتی ووشتر

رادەی گەیشتنی ووشتر بۆ زەکات لێ واجب بوون (٥)وشترە جا هەر کاتێك گەیشتە (٥) سەر وە یان زیاتر زەکاتەکەی بەم شێوەیە:-

١)لە (٥) ووشتر مەرێك یان بزنێك .لە (١٠) ووشتر دوو مەر یان دوو بزن .لە ١٥ ووشتر سێ مەر یان سێ بزن .لە (٢٠)بیست ووشتر (٤)چوار مەر یان (٤)بزن).

٢)لە(٢٥)بیست و پێنچ ووشتر مێچكە وشترێكی یەك ساڵی .لە (٣٦)سی وشەش سەر مێچكە ووشترێكی دوو ساڵی .لە (٤٦)چل و شەش سەر مێچكە ووشترێكی سیٚ ساڵی .لە (٦١)سەر مێچكە ووشترێكی چوار ساڵی لە (٧٦) سەر دوو مێچكە ووشتر (٢)دووساله . لە (٩١)سەر دوو مێچكە ووشتر (٣)ساڵە .لە (١٢١)سەد و بیست و یەك سەر مێچكە ووشتری سیٚ ساڵی .

٣) ئەگەر هاتوو لە(١٢١) سەد وبیست و یەك زیاتر بوو ئەوا لە هەر (٤٠) سەر مێچكە وشترێكی دوو ساڵی یان لە هەر (٥٠) سەر مێچكە ووشترێكی (٣) سیٚ ساڵی واجبە جا بۆ نمونە سەیری حیسابی خوارەوە بكە .لە(١٣٠)سەر مێچكە ووشترێكی (٣) سیٚ ساڵی و دوو مێچكە ووشتری دوو ساڵی . لە (١٤٠)سەر مێچكە ووشترێكی دوو ساڵی و دوو مێچكە ووشتری سیٚ ساڵی . لە دوو سەد سەر ،چوار مێچكە ووشتری سیٚ ساڵی ئەگەر دابەشی(٥٠) بكەین یان (٥) مێچكە ووشتری دوو ساڵی ئەگەر دابەشی (٤٠)ی بكەین.

## زەكاتی گا و مانگا و گامێش

**وأول نصاب البقر ثلاثون وفيها تبيع، وفي أربعين مسنة ،وعلى هذا أبدا فقس.**

**واتە: یەكەم نیسابی رەشە ولاغ سی سەرە، وە گولكێكی یەك سالی تێدا واجبە ، وە لەچل سەر گۆلكە مێیەكی دووسالی، هەر چەند زیادی كرد بەم پێوەرە كاربكە .**

**ئەوەش بە گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (فِي ثَلاَثِينَ مِنَ البَقَرِ تَبِيعٌ أَوْ تَبِيعَةٌ وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ». أخرجه الترمذي وابن ماجه[1]. واتە : واجبی زەكات لە هەر**

---

([1]) **صحيح/** أخرجه الترمذي برقم (٦٢٢)، وهذا لفظه، وابن ماجه برقم (١٨٠٤).

سی سەر گا یان مانگ گولکێکی یەك سالیە یان لە هەر چل سەر گۆلکە مێیەکی دووسالی

## زەکاتی رەشە وولاّخ

مەبەست لە رەشە وولاّخ و مانگا و (چێل) گا و گامێش ئەندازەی گەیشتنی رەشە وولاّخ بۆ زەکات لێ واجب بوون (٣٠)سەرە هەر کاتێك گەیشتە ئەم ژمارەیە و زیاتر زەکاتەکەی بەم شێوەیە دەبێت :

لە (٣٠)سەر گۆلکێکی یەك ساڵی واجبە لە (٤٠) مێچکە گۆلکێکی دوو ساڵی .لە(٦٠)سەر دوو گۆلکی یەك ساڵی .

بەلاّم ئەگەر لە(٦٠)شێست سەر زیاتر بوو بەم شێوەیە دەبێت :

یان لەهەر(٣٠)سەر گۆلکێکی یەك ساڵی یان لەهەر (٤٠)سەر گۆلکێکی دوو ساڵی بۆ نمونە:-

لە(٧٠)حەفتا سەر گۆلکێکی دوو ساڵی واجبە ،لەگەل گۆلکێکی یەك سالی،چونکە(٧٠)لە(٤٠)+(٣٠)پێك هاتووە دوو ساڵی یەکە بۆ(٤٠)سەرەکە یەك ساڵی یەکە بۆ (٣٠) سی سەرە کە .

لە هەشتا سەر ،دوو گۆلکی دوو ساڵی (٤٠+٤٠) ، لە(٩٠) سەر سێ گۆلکی یەك سالی (٣٠+٣٠+٣٠) ،لە سەد سەر گۆلکێکی دوو ساڵ بەرامبەر بە چل سەر ، وە دوو گۆلکی یەك ساڵی بەرامبەر(٣٠+٣٠) لە (١١٠) سەر دوو گۆلکی دوو ساڵی و یەك گۆلکی یەك ساڵی لە سەد وبیست سەر چوار گۆلکی یەك ساڵی یان سێ گۆلکی دوو ساڵی جا بەم شێوەیە دەچیتە دوایی لە حیساب کردنی .

## زكاة الغنم

## زەکاتی مەر وبزن

**وأول نصاب الغنم أربعون وفيها شاة جذعة من الضأن أو ثنية من المعز وفي مائة وإحدى وعشرين شاتان وفي مائتين وواحدة ثلاث شياه وفي أربعمائة أربع شياه ثم في كل مائة شاة.**

**ئەندازەی گەیشتنی مەر و بزن بۆ زەکات لێ واجب بوون (٤٠)چل سەرە ، هەر کات یەکێك (٤٠)سەری هەبووکە سالی بەسەردا سورایەوە ئەوە زەکاتەکەی بەم جۆرەیە:-**

**لە هەر(٤٠)چل سەر ،مەرێك یان بزنێك تا دەگاتە (١٢١)سەد و بیست ویەك سەر، ئەوە(٢)دوو دانە واجبە ،تا دەگاتە(٢٠١)دوو سەد و یەك سەر ، ئەو کاتە (٣)سێ سەر واجبە.تا دەگاتە (٤٠٠)چوار سەد سەر، چوار سەر واجبە پاشان ئەگەر لە(٤٠٠)چوار سەد سەر زیاتر بوو ، لەهەر(١٠٠)سەد سەر ، یەك سەر دەردەکات بۆ زەکات دان .**

## شروط زكاة الخليطان

## مەرجەکانی مالی تێکەلاو

**والخليطان يزكيان زكاة الواحد بسبع شرائط: إذا كان المراح واحدا والمسرح واحدا والمرعى واحدا والفحل واحدا والمشرب واحدا والحالب واحدا وموضع الحلب واحدا.**

**ئاژەلی تێکەلاو کراو (لە لایەن دووکەس یان زیاتر) وەك یەك کەس زەکات لە**

ئاژەلەكان دەدەن (ئەگەر كۆی گشتیان دەگەیشتە نیساب) بەلام بە حەوت مەرج : ئەگەر شوێنی مانەوەی شەویان یەك بێت ،مۆلگەیان یەك بێت ، پاوان وشوێنی لەوەرانیان یەك بێت ،وە نێریان یەك بێت ،وە شوێنی ئاو خواردنەوەیان یەك بێت،وە بێریان یەك بێت (ئەوكەسەی دەیان دۆشی) ، وە شوێنی دۆشینیان یەك بێت.

بۆزانین :

لێرەدا دیسان حەنەفیەكان لەگەڵ جمهور خیلافیان هەیە .بەلای ئەوان تێكەل كردن نابێتە هۆی واجب بوونی زەكات بەلأم بەلای جمهور دەبێتە هۆی تەواوبوونی ژمارە بۆ گەیشتن بە ئەندازەی زەكات هۆی خیلاف دەگەرێتەوە بۆ تێگەیشتن و شی كردنەوەی مانای ئەم فەرموودەیە((لا يجمع بين مفترق ولا يفرق بين مجتمع))بەلأم لەگەڵ ئەمەشدا جمهور لە مەرجەكانی تێكەلاو كە ببێتە هۆی واجب بوونی زەكات خیلافیان هەیە .بەتایبەتی لە نێوان ئیمامی ماللك و ئیمامی شافعی هەروەها ئیبن حزم زۆر بە توندی دژی رای جمهور ە. بەگوێرەی ئایەتی((ولا تكسب كل نفس الا عليها))و((ولا تزر وازرة وزر اخرى)) ، وە مەزهەبی شافعی تەنها بە تێكەڵی ئاژەڵ نەوەستاوە بەڵكو لە مال و سەروەت شەراكەتی بە هۆیەكی شەرعی داناوە لە واجب بوونی زەكات هەتا لە كشتوكال و پارەش.

لەزەكاتی ئاژەلی تێكەل هەندێك لەبەرژەوەندی خاوەن ئاژەلە هەندێك جار لە زەرەریەتی، بۆنمونە :

أ- پیاوێك ئەگەر ٣٠ سی سەر مەری هەبوو زەكاتی لەسەر نییە ،بەلام ئەگەر لەگەل كەسێك تێكەلی كردن ئەو ١٠ دە سەری هەبوو ئیستا بە هەردووكیان

دەبێت یەك مەر زەکات بدەن ،ئەگەر بەتەنها بووان زەکاتیان لەسەر نەبوو .

ب- بەلام ئەگەر بەدوو کەس هەریەك ٦٠ سەریان هەبوو ،ئەگەر بەتەنها بن هەریەك دەبێت مەرێك بدات ،بەلام لە تێکەلی بەهەردووکیان یەك مەر زەکات دەدەن .

## چەند تێبینیەك لە بارەی زەکاتی ئاژەلان

١- ئاژەلی کار مەبەست حوشتری بارو گا ئەگەر بۆ جووت کردن راگیرابوو،زەکاتیان لێناکەوێت ،مەگەر بۆ کرین وفرۆشتن و بەکرێدان رایگرتبن ئەوکات زەکاتی مالی بازرگانیان لەسەر جێبەجێ دەکرێت . هەروەك ئیمامی عەلی فەرموویەتی : قال:(ليس في البَقَرِ العوامِلِ صدقةٌ)رواه أبو داود أبو عبيد وابن أبي شيبة وعبد الرزاق واتە:لە گای کارکردن زەکات نییە .

٢- ئاژەلی نەخۆش و پیرو لەر و بێکەلك بۆ زەکات نابێت.

٣- ئاژەلی ئاوس ،دابەستی ،جۆری نایاب ،ئەوەی بەرخی لەبەرە دروست نیە بەبێ رەزامەندی خاوەنی ،ئەوانەی زەکات کۆدەکەنەوە لە خەلکی بستێنن بۆ زەکات .

٤- بێچووی ئاژەل ئەگەر لەماوەی سالی دایکیان لە دایك بوون ئەوە سالی بێچووەکان سالی دایکیانە لەگەل دایکیان حیساب دەکرێن بۆ زەکات :بۆنمونە :کەسێك ٣٠ سەر مەری لە مانگی یەك کری لای مایەوە لە مانگی ١٢، ١٠ سەر مەر زان بوونە ٤٠ سەر ئەوە نیساب تەواو دەبێت و دەبێت زەکات بدات .

٥- بەلام ئەگەر بەرخەکان دوای سالی دایکیان لە دایك بوون ئەوە لە رۆژی لە دایك بونیان سالیان بۆ دادەنرێت ، بۆ نمونە:کەسێك ٩٠ مەری هەبوو لە مانگی ٢ تا مانگی ٣ سالێکی تر لای مایەوە ،دەبێت لە مانگی دوو زەکاتی ئەو نەوەت سەرە بدات چونکە سال سورایتەوە ،بەلام لە مانگی ٣ ، ٤٠ مەر زان و ٤٠ بەرخ

**زیادی كرد ئەم بەرخانە دوای سالی دایكیان لە دایك بوونە ،زەكاتیان لێناكەوێت تا سالیان بەسەردا دەسورێتەوە.**

**٦- زەكات جگە لەم ئاژەلانەی باسمان كرد لە ئاژەلی تر ناكەوێت وەك : (ئەسپ و گوێدرێژ و ئێستر ) بەلام ئەگەر بۆ تیجارەت وبازرگانی بێت هەركات نرخیان گەیشتە نیساب و سالیان بەسەردا سوراوە ، زەكاتی مالی بازرگانی لێ دەردەكەن ٢.٥٪ لە سەدا دوو و نیو .**

**٧- لە زەكاتی ئاژەل لە پەرتوكە فیقهیەكان وشەی (وقص واوقاص ) دەبینیت ، وەقس بریتییە لە و ژمارەیەی كە دەكەوێتە نێوان نیسابی یەكەم تا دەگاتە نیسابی دووەم ،لە زەكاتی ئاژەل عەفو كراوە ، بۆ نمونە: لە زەكاتی مەر نیسابی یەكەم چل سەرە، نیسابی دووەم سەدو بیست ویەك سەرە ،لە ٤١ تا ١٢٠ پێی دەگوترێ وەقس عەفوە هەر یەك مەرە كە زەكاتە .**

# پوختەی زەکاتی ئاژەڵ

| مەر وبزن | | |
|---|---|---|
| ئەندازەکەی | | زەکاتەکەی |
| لە | بۆ | |
| ٤٠ | ١٢٠ | مەرێك |
| ١٢١ | ٢٠٠ | دوو مەر |
| ٢٠١ | ٣٠٠ | سێ مەر |
| پاشان لە هەر ١٠٠ مەرێك | | |
| دروست نیە بۆ زەکات، ئاژەڵی نەخۆش و لەر و، ئاوس، بەرخی لەبەر بێت، یان دابەستی بێت ،یان نایاب و زۆر نرخی بەرز | | |

| حوشتر | | |
|---|---|---|
| ئەندازەکەی | | زەکاتەکەی |
| لە | بۆ | |
| ٥ | ٩ | مەرێك |
| ١٠ | ١٤ | دوو مەر |
| ١٥ | ١٩ | سێ مەر |
| ٢٠ | ٢٤ | چوار مەر |
| ٢٥ | ٣٥ | بنت مخاچ |
| ٣٦ | ٤٥ | بنت لبون |
| ٤٦ | ٦٠ | حقه |
| ٦١ | ٧٥ | جڑعه |
| ٧٦ | ٩٠ | بنتا لبون |
| ٩١ | ١٢٠ | حقتان |
| ١٢١ | ١٢٩ | پلاپ بنات لبون |
| • لەمە زیاتر یان لەهەر چل سەر بێچوەکی دووسالی یان لە هەر پەنجا سەر بێچوەکی سێ سالی | | |

| رەشە ولاغ | | |
|---|---|---|
| ئەندازەکەی | | زەکاتەکەی |
| لە | بۆ | |
| ٣٠ | ٣٩ | گۆلکە مێبەکی یەك سالی |
| ٤٠ | ٥٩ | گۆلکە مێیەکی دوو سالی |
| ٦٠ | ٦٩ | دوو گۆلکە مێی یەك سالی |
| لەوە زیاتر لە هەر ٣٠ سەر گۆکێکی یەك سالی یان لەهەر ٤٠ سەر گۆلکێکی دوو سالی | | |
| التبیع أو التبیعة: گۆلکە مێی یەك سالە.<br>المُسنَّة: گۆلکە مێی دوو سالە | | |

- بنت مخاض: بێچووە وشترێکی مێینەی یەك سالی
- بنت لبون: بێچووە وشترێکی مێینەی دوو سالی
- حقە: بێچووە وشترێکی مێینەی سێ سالی
- جذعة : بێچووە وشترێکی مێینەی چوار سالی

زكاة الذهب والفضة

## زەكاتی زێر و زیو

ونصاب الذهب عشرون مثقالا وفيه ربع العشر وهو نصف مثقال وفيما زاد بحسابه ، ونصاب الورق مائتا درهم وفيه ربع العشر وهو خمسة دراهم وفيما زاد بحسابه ولا تجب في الحلي المباح زكاة.

وە ئەندازەی گەیشتنی زێر بە زەكات لیٚ واجب بوون، بیست میسقالە،وە زەكاتەكەشی چارەكی دەیەكە كە دەكاتە نیو میسقال، جا چەند ڕێژەی زیادی كرد زەكاتەكەی بەم پێوەرە دەبێت ٢،٥٪ لە سەدا دوو و نیو .

وە نیسابی زیو (٢٠٠) درهەمی زیوە ،وە زەكاتەكەی چارەكی دە یەكە ، كە دەكاتە (٥ درهەم) جا چەند زیادی كرد بەم پێوەرە زەكاتەكەی دەدەیت ٢،٥٪ لە سەدا دوو و نیو . هەر وەكو زێر.

## زەكاتی پارە ( پول ) دراو..

مەبەست لە پارە (دینار و ریال و پاوەند و دۆلار و لیرە و تومەن و ....هتد) واتە ئەو شتانەی كە ئەمرۆ لەبازارەكانی جیهاندا ئاڵ و گۆر و كرین و فرۆشتنی پێدەكرێت..

جا ئایا زەكات لە پارە واجبە؟ وە رادەی گەیشتنی بە ئەندازەی زەكات لیٚ واجب بوون چەندە؟

ا-موسڵمانی بەرێز: كاتی خۆی لەسەردەمی دەوڵەتی ئیسلام دیناری زێر و درهەمی زیوو لە ئاڵ و گۆر و كرین و فرۆشتن دا بەكار دەبردران..وە هەر یەك دینار زێر كە دەكرا خوردە دەیكردە (١٠) دە درهەمی زیوو وە هەندیٚ جار نرخی دینار گەیشتۆتە (١٢) دوانزە درهەمی زیوو

بەلاّم ئاشكرایە ئەمرۆ ئەوە نەماوە.بەڵكو شتی تر بەكاردەبردرێت وەك دینار و ریاڵ و دۆلار ...هتد

ب-هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە كۆكن (موتەفیقن) كە زەكات لەو شتانەی باسمان كرد واجبە چونكە زەكات پاش ئەوەی خوا پەرستی یە...گرینگترین ئامانج (هدف) لە واجب بوونی یارمەتی دانی هەژارانە و جیٚ بەجیٚ كردنی پێداویستیەكانیانە..جا هەرشتێك ئەم ئامانجەی پیٚ بێتە دی جیاوازی نیە چ دینار بێت چ زێر ....هتد

هەروەك لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بە حیكمەتی زەكات كراوە (صدقة توخذ من اغنیائهم فتردعلی فقراء هم)

## ئەندازەی گەیشتنی پارە ( دراو ) بۆ زەكات لیٚ واجب بوون

خوێنەری ئازیز: لەپێشەوە ئەوەمان سەلماند كە پارەی ئەمرۆ لەجێگای زێر و زیوی كۆنە..كە وابێت رادەی گەیشتنی پارە بۆ زەكات لیٚ واجب بوون (٢٠)

میسقالُ زێره یان (١٤٠) میسقالُ زیوه...واته موسڵمان کاتێك پارەی به قەدەر نرخی (٢٠) میسقالُ زێر هەبوو یان (١٤٠) میسقالُ زیو ئینجا زەکات له پارەکەی واجب دەبێت....بەلام دەبێت ئەوه بزانین که (٢٠٠) درهەم زیو یان (١٤٠) میسقالُ زیو ئەمڕۆ له جیهاندا نرخەکەی یەکسان نیه لەگەڵ (٢٠) میسقالُ زێر هەروەکو پێشان یەکسان بوو..جا ئایا ئەمڕۆ کامەیان هەڵدەبژێرین به پارسەنگ بۆ قیمەت دانان. ئایا پارەکه بگاته نرخی (٢٠) میسقالُ زێر یان بگاته نرخی (١٤٠) میسقالُ زیو .

**له وەڵامی ئەم پرسیارەنەدا زانایان دوو رایان هەیه:**

رای یەکەم: نرخی (١٤٠)میسقال زیو پارسەنگی واجب بوونی زەکاته،کەدەکاته نزیکەی (٥٩٥)گرام زیو بەکێشی ئەمڕۆ .زۆر لەزانایانی سەردەم له وولاته جیا جیاکانی ئیسلامی ئەم ((فتوایەیان)) داوه ئەمەش لەسەر جەند بنەمایەك بەکورتی:-.

١)ئەو فەرموودانەی لەبارەی زەکاتی زیو هاتوونه پلەی راستیان بەهێزتره له فەرمووودەکانی باسی زەکاتی زێر دەکات.

٢)زەکات روکنێکی گەورەی ئیسلامه ئەگەر زیو به پارسەنگ دابنێن خەلکێکی زیاتر بەشداری لەو رکنه دەکات .

٣)پاراستنی بەرژەوەندی هەژاران له نرخاندنی پاره له زیو دایه.

رای دووەم:

١) ئەمڕۆ زێر بنەرەتی ئاڵ و گۆره له جیهاندا.

٢) پارسەنگ دانان به زیو له راستی دا زیان گەیاندنه به بەرژەوەندی هەژاران .چونکه رەوانیه بەلای زۆربەی زانایان ئەوەی مەبلەغێکی هەبێت بەقەدەر ((نیسابی زەکات)) زەکاتی بدرێتیّ یان وەری بگریّ.ئایا ئەو مامۆستایانەی ئەم فتوایەیان داوه ئەگەر هەژار بن ساڵێ کەمتر له دوو هەزار دینار بەشیان دەکات؟

٣)ئایا خاوەن پاره ئازاد نیه لەوەی پارەکەی بکات به زێر یان به زیو .

٤) ئەگەر فەرموودەكانی زەكاتی زیو پلەی راستیان بەهێز تربێت .ئەوا زەكاتی زێریش لە قورئان هاتووە لەپێش زیو ((والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونهافي سبيل الله...)).

ولا تجب في الحلي المباح زكاة.

## وە زەكات لە خشلی حەلال واجب نییە

## خشلی ئافرەت

مەبەست پیٌ ئەم زێر و زیوەیە كە ئافرەت بۆ جوانی و خۆرازاندنەوە بەكاری دەهێنێت وەك (ملوانكە،بازن،خلخالٌ،گوارە.....) بەلای ئیمامی شافعی و ئیمامی مالك و ئیمامی ئەحمەد زەكاتی لیٌ ناكەوێت بەمەرجێك ئەوەندە زۆر نەبێت لەسنوری خۆ رازاندنەوە دەرچووبێت..وە لە ئاستی عورف و عادەتی كەس و خەڵك و شوێن تێنەپەری بێت...

بەلاٌم ئەگەر لەم سنوورە دەرچووبێت و زیادە رەوی (اسراف)ی تێدا كردبێت ئەوا دەبێت زەكات بدات لەهەر (٤٠) میسقالٌ زێر (١) یەك میسقالٌ زێر وە لە هەموو خشلەكەی...

وە ئەندازەی زیادە رەوی لە مەزهەبی ئیمام شافعی بە (٢٠٠) دیناری زێر و زیاتر لە قەڵەم دراوە.. نەوەوی فەرموویەتی: زانایانی شافعی مەزهەب فەرموویانە : خشل تا ئەو ئەندازە حەلالە زەكاتی لیٌ ناكەوێت نەگەیشتبێتە بواری ئیسراف ، فەرموودەی راست وبەهێز لە مەزهەبی شافعی ئیسراف حەرامە وەك خلخالێكی دووسەد دیناری زێر ئەوە زەكاتی لێدەكەوێت .

هەروەك پێغەمبەریشمان ﷺفەرموویەتی: «كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَالْبَسُوا وَتَصَدَّقُوا، فِي

غَيْرِ إِسْرَافٍ وَلَا مَخِيلَةٍ»" رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ مُعَلَّقًا مَجْزُومًا بِهِ، وَوَصَلَهُ جَمْعٌ مِنَ الْأَئِمَّةِ.
واتە:بخۆن وبخۆنەوە و لەبەربکەن و خێر وسەدەقەش بکەن ،دوور لە ئیسراف و فیز وخۆبەزل زانی.

بەرێزان: سنوری خشلی حەلال بۆ خۆجوانکردنی ئافرەت بە پێی عورف و عادەت لە کۆمەلگایەك بۆ کۆمەلگایەکی تر دەگۆرێ ئافرەتەکی کوردو ئافرەتەکی ولاتی ئیمارات لە عادەت و تەقالید جیاوازن ، بۆیە لە کۆمەلگای کوردەواری لە کوردستانی باشوور، بە بروای من عورفی خۆجوانکردن، ملوانەکەیەك ،گوارە، بازن ،قایش ،....ناگاتە ٨٠ میسقال. واللہ اعلم.

بەلاُم لە مەزهەبی ئیمام حەنەفی زەکات لە خشلی ئافرەت واجبە هەرکاتێك گەیشتە (٢٠) بیست میسقالُ نیو میسقالُی زەکات لیُ دەدات..

تێبینی:

ا-کەل و پەلی لە زێر و زیوو دروست کراو وەك قەلُەم و خەنجەر قاپ و پەرداخ و ....هتد..زەکاتیان لیُ واجبە چونکە بە خشلُ داناندرێن......

ب-ئەو فەرموودانەی کە هاتوونە لەبارەی واجب بوونی زەکات لە خشلی ئافرەت هەموویان جێگای ئیتفاق نین وە لەلایەن زانایان قسەی زۆریان لەسەر کراوە.......

ج-ئەو فەرموودانەی باس لە حەرام کردنی بەکارهێنانی زێر و زیوو بۆ ئافرەتان دەکات بە (اجماع)ی زانایات نەسخ کراون..

د- دروستکردنی ملوانکە و بازن لە شێوەی مار و گیانلەبەران حەرامە ئەوکاتە زەکاتی لێدەکەوێت ئەگەر گەیشتە ٢٠ بیست میسقال .

ە – خشل کرین بە نیەتی کرین و فرۆشتن چ ئافرەت بیکات چ پیاو زەکاتی لیّ واجبە .

و- خشلی پیاو زەکاتی لیّ واجبە ، وەك سەعات و خەنجەر و دەمانچەو چەکەکانی تر ....

## زكاة الزروع والثمار

## زەکاتی دانەوێڵە و میوە

**ونصاب الزروع والثمار خمسة أوسق وهي: ألف وستمائة رطل بالعراقي وفيما زاد بحسابه وفيها إن سقيت بماء السماء أو السيح العشر وإن سقيت بدولاب أو نضح نصف العشر.**

**وە نیسابی گەیشتنی دانەوێلە و میوە بە زەکات، پێنج ویسقە کە دەکاتە هەزاروشەشسەد ریتل بە پێوەری عێراقیەکان ،جا هەرچەند زیاد بکات بەم شێوە زەکاتەکەی حیساب دەکرێت :**

**ئەگەر بە ئاوی ئاسمان ئاودرابوو یان جۆگەو رووبار زەکاتەکەی دەیەکە(دەکاتە ١٠٪) ، بەلام بە دۆب و تورومپا و هەلێنجان ئاو درابوو ،زەکاتەکەی نیوەی دەیەکە (دەکاتە ٥٪).**

**هەروەك لەفەرمودەی سەروەرمان هاتووە : (فِيما سَقَتِ السَّمَاءُ والعُيُونُ أَوْ كانَ عَثَرِيًّا العُشْرُ، وما سُقِيَ بالنَّضْحِ نِصْفُ العُشْر) ِ.صحيح البخاري رقم :١٤٨٣.**

**واتە:ئەو دانەوێلەو میوانەی بە ئاوی باران وکانی وروبار ئاو دەدرێن زەکاتەکەیان دەیەکە،وە ئەوەی بەئاژەل و دەرهێنان ئاو بدرێت زەکاتەکەی نیوەی دەیەکە.**

**بەرێزان :**

**دانەوێلە ،گەنم وجۆ و ماش و برنج ونیسك و نۆك دەگرتەوە ،ئەو کاتەی**

دانەکانی وشك بوون پێگەیشتن زەکاتی لیَ واجب دەبێت ، وە پاش خاوێنکردنەوەیان لە کا و چەلتوك و پوش بە خاوێنی زەکاتەکەی دەدرێت .

وەسەبارەت بە میوە ،تریَ و خورما دەگرێتەوە،کەبەرەکە پێگەیشت زەکاتی لیَ واجب دەبێت ،تا زەکات نەدات نابێت ،بیکاتە دیاری ولێی بخوات چونکە مافی هەژارانی تێدایە ،بۆیە دەبێت خەملاندنی (خرص) بۆ بکرێت.

## خەملاندن چۆن دەکرێت ؟؟

کە رەزی تریَ یا باخچە بەرەکەی پێگەیشت ،هەروەها بۆ دارخورماش ،دوو موسلمانی شارەزا و لە خواترس تەماشای باغەکە دەکەن ،بەقەناعەت دەلێن ئەم رەزە یان ئەم باخچە ئەوەندە کیلۆیە یان تۆنە ،مێوژی دەکەوتیَ یان خورمای دەکەوتیَ و زەکاتەشی دیار دەکەن لە ئەستۆی خاوەنی ،بەوە حەلال دەبێت خاوەن رەزوو باخچە دەستکاری میوەکانیان بکەن ،بۆ خواردن و دیاری و فرۆشتن ..

ئەوەش وەکو لە فەرمودەکانی پێغەمبەرمان هاتووە:

١-«کان یبعث علی الناس من یخرص علیهم کرومهم وثمارهم» رواه الترمذي وابن ماجه،

واتە: پێغەمبەری خودا کەسانێکی شارەزای دەنارد بۆ (خەرسکردنی) مێوەکان و خورما کانی خەلك .

٢-: «أمر رسول الله  أن یخرص العنب کما یخرص النخل، فتؤخذ زکاته زبیبا کما تؤخذ صدقة النخل تمرًا». رواه أبو داود والترمذي .

واتە :پێغەمبەری خودا فەرمانی کرد کە ترێش (خەرس بکرێت) هەروەك خورما خەرس دەکرێت ، پاشان زەکاتی تریَ بە مێوژ دەدریَ وە  بەری دارخورماش بە خورما.

**تێبینی :**

**لەمەزهەبی نوێی شافعی و مالیك وئەحمەد زەكات لە هەنگوین ناكەوێت ،بەلام ئەگەر بۆ بازرگانی بوو ،ئەوا وەكو مالی بازرگانی ٢.٥٪ زەكاتی دەدات ئەگەر نرخەكەی گەیشتە نیسابی پارەی .**

**بەلام بەلای مەزهەبی حەنەفی زەكات لە هەنگوین واجبە وەك بەرهەمی كشتوكالی زەكاتەكەی ١٠٪. رای جمهور بەهێزترە،چونكە فەرمودەكانی باسی زەكاتی هەنگوین دەكات لاوازن.**

## زەكاتی زەوی بەكرێگیراو بۆ كشت وكال

**زۆر جار لە كوردستان خەلك زەوی خۆی ناكاتە كشتوكال ،بەكرێ دەداتە كەسانی تر ،ئایا كێ زەكات دەدات ؟؟ خاوەن زەوی یان كرێچی ؟؟**

**بەلای جمهوری زانایان وئیمامی شافعی ،زەكات لە داهاتی زەویەكە دەكەوێت لە بەروبومە كشتوكالیەكە لە ئەستۆی كرێچیەكەیە،وە خاوەن مال ئەگەر كرێی زەویەكەی دەگەیشتە نیسابی پارە كۆتایی سال ٢.٥٪ زەكاتی پارەی لێدەدات .**

زكاة عروض التجارة

## زەكاتی كەل وپەلی بازرگانی

وتقوم عروض التجارة عند آخر الحول بما اشتريت به ، ويخرج من ذلك ربع العشر .

وە زەكاتی مالی بازرگانی لە كۆتایی سال دەنرخێندرێت بەهەمان ئەو جۆرە پارەیەی پێی كراوە ،وە زەكاتەكەشی لە ٢،٥٪ لە سەدا دوو و نیو ە.

زەكاتی مالی بازرگانی (زكاة عروض التجارة)

١- مەبەست لە مالی بازرگانی :-هەموو ئەو كەل وپەل وشت ومەك وئاژەل وخانوو ئۆتۆمبیل وبالەخانە ...هتد كە مرۆڤ بەنیازی كرین وفرۆشتن وبازرگانی پێوەكردنەوە بەكاریان دەبات .

٢- بەلای جمهوری زانایان زەكات لە مالی تیجارەت واجبە ،هەتا (ابن منذر) فەرموویەتی :-زانایانی ئیسلام كۆكن لەسەر ئەوەی ،ئەوكەل وپەلانەی بۆكرین وفرۆشتنە ئەگەر سالی بەسەردا سورایەوە زەكاتی لیٚ واجبە الاجماع ص ١٤.

هەروەها ابن قدامەی حەنبەلی فەرموویەتی:- المغنی (٣/٣٠) واجب بوونی زەكات لەمالی تیجارەت ،لە ئیمامی عومەرو عبدالله ی كوری وئیبن عباس هاتووە،وە فەتوای حەوت زانابەرزەكەی مەدینەیە (الفقهاء السبعة) كە ئەم بەرێزانەن: (سعيد بن المسيب، وعروة بن الزبير، وأبو سلمة بن عبدالرحمن بن عوف، والقاسم بن محمد ابن أبي بكر الصديق، وعبيدالله بن عبدالله بن عتبة بن مسعود، وسليمان بن يسار، وخارجة بن زيد ابن ثابت) هەروەها فەتوای: الحسن، وجابر بن زيد، وميمون بن مِهران، وطاوس، والنَّخَعي، والثوري، الاوزاعي، والشافعي، وأبو عُبيد، وإسحاق، وأصحاب الرأي، وە مەزهەبی ئیمام ئەحمەدی

کوری حەنبەلە.

بەلیٚ زۆربەی سەرچاوەکانی فیقە تەفسیر وفەرمووده بەلگەی بەهێزو جۆراو جۆریان نەقل کردووە لە واجب بوونی زەکات لەمالی تیجارەت ،تەنها مەزهەبی زاهیری خۆیان جیاکردۆتەوە ،بەلام ئەوانیش لە ئەسلی واجبی زەکاتە دەرنەچوونە بەلکو ئەندازەکەیان دیار نەکردووە ،ئەمەش دەقی قسەکانی (ئیبن حەزمە) لە کتێبی (المحلی ج٥ ص٣٤٩ ) (فهذه صدقةٌ مفروضة غير محدودة، لكن بما طابت به أنفسهم، وتكون كفارةً لِما يشوب البيعَ مما لا يصحُّ من لغوٍ وحلِفٍ) ئەمەش زەکاتێکی فەرزە بەلام سنوردار نەکراوە،بازرگانەکان بەدلخۆشی خۆیان دەیبەخشن بۆئەوەی ببێتە کەفارەتی خلت وناریٚکیەکانی هەلەو سویٚندە سەرزارەکیەکانیان.

کەواتە ئیجماعی زانایان لەسەر واجبی زەکاتی مالی تیجارەتە دەرچوون لەم ریٚگایە نەهجی خەوارجەکانە.

زانایان زۆربەلگەیان هێناوەتەوە لەسەر واجبی زەکات لەمالی تیجارەت بۆ نموونە:-

١- يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ (البقرة: ٢٦٧)

واتە :ئەی ئەوکەسانەی باوەرتان هێناوە ببەخشن لەو شتە حەلال وپاکانەی بە دەستتان هێناوە (مەبەست بازرگانی یە) وە لەوانەی لە زەوی بۆمان دەرهێناون (کشت وکال و کانزاکان دەگرێتەوە).

٢-قال صلَّى الله عليه وسلَّم: ((إن اللَّه افترض عليهم في أموالهم صدقةً تؤخذ من أغنيائهم، فتردُّ على فقرائهم) البخاري (١٤٥٨)، ومسلم (١٩)، وأبو داود (١٥٨٤)، والترمذي (٦٢٥)، وابن ماجه (١٧٨٣)

خودا لە مال و سامانیان سەدەقەیەکی (مەبەستی زەکاتە) لە سەر فەرز کردوونە

، لە دەولەمەندەکانیان وەردەگیرێت ، و دەدرێت بە هەژارەکانیان ، مال و سامان هەموو شتێکی بەنرخ دەگرێتەوە ،مالی بازرگانیش سامانە ..

٣- *فەرمودەی* :(**یا معشرَ التُّجَّارِ إنَّ البیعَ یحضرُهُ الحلِفُ واللَّغوُ فشوبوهُ بالصدقة** )
**رواه** *ابوداود* ٣٣٢٦ *والنسائی* ٣٨٠٠

ئەی کۆمەلی بازرگانان ئەم مامەلەیە ،سوێند وقسەی نەشیاوی تێدەکەوێ ،بە سەدەقە پاکی کەنەوە .

مەرجەکانی واجب بوونی زەکات لەمالی بازرگانی

١- ئەو کەل وپەلانە بەنیەتی کرین وفرۆشتن بەکار ببات .

٢- نرخەکەیان بگتە ئەندازەی زەکات لیٚ واجب بوون .

٣- سالی بەسەردا سورابیێتەوە .

چۆن زەکات لەمالی تیجارەت دەدرێت ؟

کەسالی کۆچی بەسەر دەستپێکی دەستکردن بەکارەکە سورایەوە ،هەرچی کەل وپەلی کرین وفرۆشتنە جەردیان دەکات ،و بەنرخی رۆژ و بەنرخی (جملە) دەیانقرسێنی (نرخداریان) دەکات ئەگەر مامەلەی بە جوملە بوو ،وە بە مفرد ئەوەی تەنها مامەلە بە مفرد دەکات ،وەلەگەل ئەو پارەی لەدەستیتی هەمووی کۆدەکاتەوە زەکاتەکەی لە ٢،٥٪ لە سەددا دوو و نیوە ،واتە لە هەر یەك ملیۆن دیناری عێراقی بیست و پێنج هەزار دینارە ،لە دەفتەرێك دۆلار دوو وەرەقەو نیوە . هەر چەند زیادی کرد بەم شێوە حیساب دەکرێت .

**چەند تێبینیەك:**

١- ئەو کەل وپەلانەی مرۆڤ بۆپێداویستی خۆی دەیکریٚ ،زەکاتی لێناکەوێت ،وەك ئۆتۆمبیلی شەخسی ،خانوو ،کەلو پەلی ناومال سەلاجە وکۆمبیوتەرو سبلیت و ....هتد .

٢-کارگەکان، کۆمپانیاکان ،دوکان و مۆل و دەواجن و بەنزینخانە و مولیدە ئەهلیەکان وشارەکانی یاری نەخۆشخانە ئەهلیەکان ،زەکات لەکەل وپەلەکان نادەن ،تەنها زەکات لەو شتانە دەدەن کە کرین وفرۆشتنی پێدەکرێت ،و لەو پارەی بەدەستیان دەکەوێت .

## زەکاتی موچەی مانگانە ( راتب الشهری )

زەکات بە دوو مەرج لە مووچەی مانگانە دەکەوێت :

١- پاشەکەوتەکە بگاتە ئەندازەی نیساب کە قیمەتی ٨٥ گرام زێری عەیار ٢٤ .

٢- سالی بەسەردا بسورێتەوە .

هەرکەسێك مووچەکەی بگاتە ئەندازەی زەکات و سالی بەسەردا سورایەوە ،دەبێت زەکات بدات کە ٢.٥٪ وە واتە لە هەر ملیۆنێك بیست وپێنج هەزار .

وە ئەوە تەنها فەرمانبەرە موچە بەرزەکان دەگرێتەوە کە دەتوانن بەشێکی پاشەکەوت بکەن ، بەلام ئەوانەی بەشیان ناکات و هیچی نامێنێتەوە ،زەکاتیان لەسەر نییە .

وەشێوەی دەرکردنی زەکاتەکەیان ،دەتوانن هەموو مانگ ئەوبەشەی بۆ پاشەکەوتی داناوە یەکسەر زەکاتەکەی بدات ، یان سالانە مانگێك دیار بکات ، هی هەمووسالەکە بدات .

## زەکاتی پشکی کۆمپانیاکان ( اسهم الشرکات )

خاوەن پشك کەسال بەسەر کرینی پشکەکانی سوراوە ، ئەوە نرخی پشکەکانی بەنرخی رۆژ لەگەل ئەو قازانجەی هاتۆتەسەری زەکاتی هەمووی دەدات وەك

مالی بازرگانی . چونكه هەر سامان و پارەیەك گەیشتە نیساب و سالی بەسەردا سوراوە ، زەكاتی واجبە.

**زەكات دان بە رێكخراوەكانی خێر خوازی بۆ دابەشكردنی بەسەر ئەوانەی موستەحەقی زەكاتن ؟**

ئەگەر ئەو رێكخراوانە جێگای باوەری بن، وە شارەزابن لە حوكمە شەرعیەكانی زەكات دروستە ،چونكە دەچێتە بابەتی وەكیل گرتن ئەوەش دروستە ، وەلەكاتی پارەكەیان دەدەیتێ پێیان رابگەیەنە كە ئەوە زەكاتە نەك خێر ،بۆ ئەوەی بگاتە موستەحەقی خۆی .

## زەكاتی كان و كانزاكان

**وما استخرج من معادن الذهب والفضة يخرج منه ربع العشر في الحال**

وە ئەو زێر و زیوەی لە كانەكان دەردەهێنرێن ،ئەگەر پاكەكەی گەیشتە نیسابی زێر و زیو دەبێت یەكسەر زەكاتەكە بدات (سال سورانەوەی پێویست نییە) . كە ئەندازەی زەكاتەكەشی چارەكی دەیەكە واتە : ٢،٥٪ لە سەدا دوو و نیو ە.

**رونكردنەوە:**

كانزا بەو شتانە دەگوترێ كە لەناخی زەوی هەیە و دەردەهێنرێت، جا هەیە رەقە ،بە ئاگر دەتوێندرێتەوە وەك : زێرو زیو و ئاسن و مس و رەساس ...،وە هەیانە شلە وەك نەوت وقیر ... .

بەلای ئیمامی شافعی تەنها لەزێر و زیو زەكات دەكەوێت چونكە نەختن ،بەلام لە

مەزهەبەکانی تر جمهوری زانایان لەهەموو کانزاکان دەکەوێت ،وەك :نەوت و گۆگرد و ئەلماس .. وە ئەو رایەش بە هێز ترە هەر وەك لەم ئایەتە پیرۆزە هاتووە : (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ) ﴿البقرة: ٢٦٧﴾.

واتە: ئەی ئەوکەسانە باوەرتان هێناوە ببەخشن لە شتە پاك و حەلالانەی بە کەسابەت بەدەستتان هێناوە ،وە لەو شتانەی لە زەویدا بۆمان دەرکردوونە (هەموو کانزاکان دەگرێتەوە) .

لە راستی نەوتیش زەکاتی لیٚ واجبە ،چونکە نەختە ،وە پێشی دەگوتریٚ زێری رەش ،ئەگەر ولاتانی ئیسلامی تەنها زەکاتی نەوت بدەنە هەژارەکانیان هیچ کێشەکی ئابووری نامێنێت .

رۆژانە ولاتانی ئیسلامی نزیکەی ١٨ ملیۆن بەرمیل نەوت بەرهەم دێنن ئەگەر لە ٢.٥٪ بکەنە زەکات دەکاتە چەند ؟؟؟چۆن باسی هەژاری و کێشە دەکەن ،بەلام گەندەلی و زولم ولاتەکانی وێران کردووە .

## زەکاتی گە نجینە شاراوەکانی پێش هاتنی ئایینی ئیسلام

**وما يوجد من الركاز ففيه الخمس**

وە ئەو زێر و زیوە شاراوانەی پێش ئیسلامەتی ئەگەر دۆزاوە ،وە دەگەیشتە نیساب ، دەبێت یەکسەر زەکاتی بدات (سال سورانەوەی پێویست نییە) وە ئەندازەی زەکاتەکەشی پێنج یەکە واتە: ٢٠٪ . واتە :چوار بەش بۆ خۆیەتی بەشی پێنجەم دەبێتە زەکات .

دەبێت ئەو گەنجینە هی پێش ئیسلامەتی بێت ،ئەگەر نیشانەی ئیسلامەتی لەسەر بوو وەك مالی وون بوو مامەلەی لەگەل دەکرێت .

وە دەبێت لە زەویەکی مولکی خۆی بێت ،یان لە زەویەك چیایەك بێت کە مولکی کەس نەبێت ،چونکە خاوەن مولك دەتوانی داوای بکات و دەبێتە مولکی ئەو .

## زكاة الفطر

## زەکاتی سەرفترە

وتجب زكاة الفطر بثلاثة أشياء :الإسلام ، وبغروب الشمس من آخر يوم من شهر رمضان ، ووجود الفضل عن قوته وقوت عياله في ذلك اليوم.

وە زەکاتی فیتر (سەرفیترە) بەهاتنە جێی سیٚ شت واجب دەبێت : موسلمانیەتی ، ئاوابوونی خۆری رۆژی کۆتایی رەمەزان ، زیاتر لە مەسرەفی خۆیی و مال و مندالی هەبێت بۆ شەوو رۆژی جەژن .

ويزكي عن نفسه وعمن تلزمه نفقته من المسلمين صاعا من قوت بلده وقدره خمسة أرطال وثلث بالعراقي .

وە موسلمان دەبێت سەرفترەی خۆیی و هەموو ئەو موسلمانانە بدات کە نەفەقەیان (بەخێو کردنیان) لە ئەستۆی ئەوە، وە ئەندازەکەشی بۆ هەر نەفەفەرێك ، یەك ربە خواردنە لە خواردنی زۆربەی خەلکی ناوچەکە بەکاری دێنی ، کە ئەندازەی پێوانی ربەکە دەکاتە پێنج رەتل و سیٚ یەکی رەتلێك بە

پێوانەی عێراقیەكان .
عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ الله زَكَاةَ الفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ. أخرجه أبو داود وابن ماجه حسن/ أخرجه أبو داود برقم (١٦٠٩)، وهذا لفظه، وابن ماجه برقم (١٨٢٧).
واته زەكاتی سەرفترە هۆیەكە بۆ پاك بوونەوەی ڕۆژووگر لە تاوان وقسەی خراپ ،وە خواردنێكیشە بۆ هەژاران ،ئەوەی پێش نوێژی جەژن بیدا ئەوە زەكاتێكی قەبول كراوە ،وە ئەوەی دوای نوێژی جەژن بیدات خێرێكە لە خێرەكان .
وَعَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيِ اللهُ عَنْهُمَا قال: فَرَضَ رَسُولُ الله, زَكَاةَ الفِطْرِ, صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى العَبْدِ وَالحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالكَبِيرِ، مِنَ المُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاةِ. متفق عليه أخرجه البخاري برقم (١٥٠٣)، واللفظ له، ومسلم برقم (٩٨٤). واته :پێغەمبەری خودا ﷺزەكاتی فیتری لەسەر موسلمانان فەرز كرد كە ربەیەك لە خورما ،یان ربیەك جۆ ،لەسەر ئازاد و كۆیلە ،نێرو مێ،بچووك وگەورە لە موسلمانان ،و لێە ئەمری كرد بدرێت (بە هەژاران) پێش ئەوەی خەلك بچێت بۆ نوێژی جەژن .
تێبینی:
بەلای ئیمامی شافعی دروستە لە سەرەتای رەمەزانەوە سەرفترە بدەیت .
وە ئەوەی لەبیری كرد یان نەیدا دەبێت ،قەزای بكاتەوە، وتۆبە بكات چونكە گوناهێكی گەورەیە.
سەرفترە پەیوەندی بەرۆژی جەژنە بۆیە ،موسلمان رۆژی جەژن لە كوێ بوو ئەوا لە خواردنی ئەو شوێنە سەرفترە دەدات ،ئەگەر پارەی دا ، بەنرخی ئەوشوێنەی لێیبوو رۆژی جەژن پارە دەدات .
سەرفترە عیبادەتە لە كاتی دانی یان تەسلیم كردنی بە وەكیل دەبێت لە دلدا نیەتی سەرفترەت هەبێت ،وە ئەو كورو كچانەی بالغن كە خاوەن كار و مووچەن

ئەوانیش دەبێت ئیزنیان لیّ وەربگیرێت و نیەت بێنن كاتێك باوك یا برا لە جیاتیان دەدات .

ئەوەی زیاتر لە پێداویستی خۆی و ئەوكەسانەی نەفەقەیان لەسەرە بۆ رۆژی جەژن ، ئەوە واجبە سەرفترە بدات ، بەلای جمهوری زانایان (مەزهەبەكانی شافعی ومالیكی وحەنبەلی) بەلام كەسێك هیچی نەبوو لە كرێی خانوو و پێداویستی جەژن سەرفترەی لەسەر واجب نییە .

تێبینی : بەلای هەندێك لە زانایان دروستە پارە لە جیاتی خواردن بدرێت ،ئەوانە پیرۆزی دەدەنە (مقاصد الشریعة ) نەك لەفزەكان ئەمانەش :حەنەفیەكان المبسوگ ١٥٨/٢ ،ئیمام بوخاری باب العرض في الزكاة،عومەری كوری عبدالعزیز ،حسن البصری وە زۆری تریش مصنف ابن أبی شیبە ٣٧/٤-٣٨ .

زەكاتی سەرفترە بەلای جمهوری زانایان دەدرێتە هەشت چینەكەی زەكاتیان بۆ دروستە .

## مصارف الزكاة

## ئەوانەی زەكاتيان دەدرێتێ

**وتدفع الزكاة إلى الأصناف الثمانية الذين ذكرهم الله تعالى في كتابه العزيز في قوله تعالى: (إنما الصدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم وفي الرقاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل) وإلى من يوجد منهم ولا يقتصر على أقل من ثلاثة من كل صنف إلا العامل.**

**وە زەكات تەنها دەدرێت بەو هەشت تاقمەی كە خودا لە قورئانی پیرۆز و بەرز ناوی هێناون لە سورەتی تەوبە :(بەراستی زەكاتەكان تايبەتن و مولكی نەداران و هەژاران و........) .**

**١- الفقراء – نەداران –ئەوكەسەيە هيچی نييە ،نەمال و سامان نە كارو كەسابەتێك بتوانی پێی بژيت .**

**٢- المساكين : هەژاران ،هەژار ئەوكەسەيە ،شتێكی لە مال و سامان و كار هەيە بەلام بەشی ناكات ،بەم ئەندازە بەرێوە ناچێت .**

**٣- العاملون عليها:ئەو فەرمانبەرانەی كە دەولەت كاری كۆكردنەوە و دابەشكردنی زەكاتيان پێ دەكات ، ئەگەر موچەيان نەبوو لە زەكات بەشيان دەدرێت .**

**٤- المؤلفة قلوبهم : بۆ راگرتنی دلی ئەوكەسانەی تازە موسلمان بوونە ،يان ئومێدی موسلمان بوونيان هەيە ،يان بۆ ئەوەی موسلمان لە شەرو خراپەيان دووربن .**

**عومەری كوری خەتتاب لەسەردەمی خيلافەتی ئەم بەشەی راگرت ،گوتی : ئيسلام لەپەری شكۆ و سەربەرزييە ،منەتمان بەكەس نييە لەكەسيش ترسمان نييە.**

بەلای ئیمامی شافعی وئیمامی مالیك ،ئەوانە زەکاتیان نادریٚتیٚ ،بەلام زانایانی ئەو دوو مەزهەبە ریٚگایان داوە ،چونکی حوکمی ئایەتەکە بەردەوامە ،بەسەردەم و شویٚن دەگوریٚت ، ئەوەش رای پەسەند و بەهیٚزە .

٥- فى الرقاب : بۆ ئازادی کردن لە کۆیلایەتی ،ئەگەر موسلمانیٚك کۆیلە بوو زەکاتی دەدریٚتیٚ بۆ بە دەست هیٚنانی ئازادی ،خۆ کرینەوەی لە گەورەکەی .

٦- الغارمون : قەرز داران ،ئەوانەی لە پیٚناو بەرژەوەندی گشتی توشی قەرز بوون ،یان خۆیان توشی قەرزبوون جا لە رووداو و کارەسات ،گرنگ ئەوەیە لە ریٚگای شەرعی نەك لە ریٚگای حەرام و ریباو قومار توشی قەرزداری هاتبن ، وەکاتی دانەوەی قەرزەکەیان هاتبیٚ و نەیان بیٚت بیدەنەوە.

٧- فى سبيل الله : بۆ جیهاد و دابینکردنی پیٚداویستی موجاهیدان لە موچە و چەك و تەقەمەنی و خۆراك و پیٚداویست ،ئەوانەی خۆبەخشن لەلایەن دەولەت موچە وەرناگرن .

وە هەندیٚ لە زانیان دەلالەتیٚکی فراوانیان بە وشەی (سبيل الله) داوە ،زۆر شت دەگریٚتەوە وەك : زانایان و قوتابیانی زانستی شەرعیش ئەگەر هەژاربوون ،لەبەر خەریك بوون بە زانست و خزمەت بە زانستی شەرعی دروستە زەکاتیان بدریٚتیٚ ، هەروەها بۆ دروستکردنی ریٚگا و بان و نەخۆشخانە....

٨- ابن السبيل : ریٚبوار :ئەوکەسەی لەسەفەردایە و پارەی لیٚبرایە ، بەقەدەر پیٚویستی دەدریٚتیٚ تا دەگاتەوە شویٚنی خۆی ، بەمەرجیٚك لەسەفەریٚکی حەلالی شەرعی بیٚت .

**تیٚبینی:**

أ-دروستە دەولەمەند پیٚش سورانەوەی سال ، زەکات دان بە پیٚش بخات وەك : پیٚغەمبەر ریٚگای داوە بە عەباسی مامی ، ئەمەش رای جمهوری زانایانە ، شافعی و حەنەفی و ئەحمەد .

ب – بەلای جمهوری زانایان (مالیکی وحەنبەلی و حەنەفی)مەرج نییە زەکاتەکەی بداتە هەر هەشت تاقمەکە ، دروستە بیداتە کەسێك یان چەند کەسێك ، بەلای ئیمامی شافعی ئەگەر زەکاتەکە دەولەت دابەشی دەکرد ،دەبێت هەر هەشت تاقم بگرێتەوە ، بەلام ئەگەر خاوەن مال دابەشی کرد

ئاساییە بیداتە کەسێك یان چەند کەسێك وا چاکە لە سێ کەس کەمتر نەبێت .

ج– گواستنەوەی زەکات لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر ،واچاکە دەولەمەند لەو شوێنەی تێیدا دەژیت زەکاتەکەی بداتە هەژارانی ئەو شوێنە ، ئەوە رای بە هێزە لای زانیان . بەلام ئەگەر لە شوێنێکی تر خەلکی موحتاج ترهەبوو بە تایبەت ئەگەر خزم بن ،یان لە شوێنێك کارەساتی سروشتی وپەتاو جەنگ هەبێت ، ئەوە دروست گواستنەوەی زەکات وە کردەوەی مەعاز لەیەمەن بەلگەیە کە زەکاتی لە یەمەن بۆ هەژارانی مەدینە هێناوە وەك لە سەحیح بوخاری هاتووە .

## زەکات دان بە گە نجان بۆ هاوسەرگیری

ئەمرۆ بەراستی قەیرەیی لە ناو کوران و کچان تەنگی بە ولات چنیەوە ،ئایا دروستە هاوکاری ئەو گەنجانەی کە خەریکی هاوسەرگیرین بکرێت لە پارەی زەکات ؟؟؟؟

وەلام: ئەگەر گەنجێك دەستگیرانی هەبوو لەبەر نەبوونی دەسەلات نەیدەگوازتەوە ،دروستە زەکاتی بدرێتێ ،چونکە پێداویستی ژیان تەنها نان و ئاو جل وبەرگ نیە ،ژنهێنان و مێرد کردن لە پێداویتی تاك و کۆمەلگایە،بەلام دوور لە ئیسراف و حەرام، وەك حەفلەو هۆل بەکرێگرتن بۆ شایی و گۆرانی ؟؟؟؟

وە ئەو گەنجانەی ئامادەن هاوسەر گیری بکەن بەلام لەبەر (هەژاری) ناتوانن ئەوانەش دروستە دەولەمەندان بەپارەی زەکات هاوسەرگیریان بۆ رێك بخەن . لە زانایانی سەردەم (علی جومعە موفتی پێشووی میسر ، ئیبن باز و ئیبن

عوسەیمین) فەتوایان پێداوە . فتاوى الشيخ ابن باز١٤/٢٧٥. هەروەها تەماشای : ﴿مغنى المحتاج ٤ /١٧٥﴾: "في فتاوى ابن البزري: أنه لو كان يكتسب كفايته من مطعم وملبس ولكنه محتاج إلى النكاح فله أخذها –يعني الزكاة– لينكح" لأنه من تمام كفايته.اهـ وهو ظاهر" انتهى.

بەرێزان: بەمەرجێك ئەو ژنهێنانە لەئاستی عورف وعادەت شەرعی بێت ،دوور لە ناشەرعی وئیسراف .

## زەکات دان بە نەخۆش بۆ چارەسەری

ئەگەر کەسێك مەسرەفی چارەسەری نەخۆشی نەبوو ، دروستە زەکاتی بدرێتێ ، چونکە چارەسەری و دەرمان بۆ نەخۆش وەك خواردن و نەفەقەیە .

زەکاتی پاداشتی کۆتایی خزمەت کەلە کاتی خانەنشینی وەردەگریت ،ئایا زەکاتی واجبە ؟

بەرێزان: دوو بۆچوون هەیە : یەکەم دەلێت ئەگەر دەگەیشتەی ئەندازەی نیساب دەبێت زەکاتەکەی بدات کەوەری گرت ، چونکە ئەو پارەیە بەشەك بووە لە مووچەکەی بە ناوی (توقيفات تقاعدیە) لێیان گێراوەتەوە .

دووەم : زەکات لێدانی واجب نییە ،چونکە مولکایەتی تەواو مەرجە لە واجب بوونی زەکات ، ئەوەش نەهاتۆتە دی ،ئەم رایە بەلای من بەهێز ترە .

زەکات دان بە کەنالەکانی ئایینی ئیسلامی بلاو دەکەنەوە، یان چاپکردنی پەرتوك بۆ بانگەوازی ئایینی خودا

ئەو بابەتە لە ولاتێك بۆ ولاتێك حوکمەکەی دەگۆرێت، وە بەگوێرەی ئاستی پێویستی ئەو کەنالانە ،موفتی فەتوا دەدات کە پێویستن و زەکاتی بۆ دروستە یان نا . والله تعالى اعلم .

## ئەوانەی زەكاتیان نادرێتێ:

وخمسة لا يجوز دفعها إليهم: الغني بمال أو كسب والعبد وبنو هاشم وبنو المطلب والكافر و من تلزم المزكي نفقته لا يدفعها إليهم باسم الفقراء .

پێنج كەس دروست نییە زەكاتیان بدەیتی :

١-دەولەمەند بە مال وسامان یان بە توانای كاركردن : هەركەسێك بە قەدەر نیسابی زەكات پارەی هەبێت دروست نیە زەكاتی بدرێتێ، وەهەركەسێك تواناو هێزی كاركردنی هەبێت ،تەمبەلی بكات و كارنەكات دروست نییە زەكاتی بدرێتێ.

وەك لەم فەرمودە هاتووە : (لا تَحِلُّ الصَّدقة لغنيّ، ولا لِذي مِرَّةٍ سَويّ ) صحيح ابن ماجة ١٥٠١

واتە : زەكات حەلال نیە بۆ دەولەمەند و وەبۆ ئەوكەسەی بەهێز و توانایە (واتە كەسێك توانای كار و كەسابەتی هەبێت).

٢-كۆیلە : زەكاتی نادرێتێ چونكە نەفەقەی لەسەر گەورەكەیەتی .

٣-نەوەكانی هاشم و نەوەكانی موتتەلیب : خزمەكانی پێغەمبەر سەدەقەو زەكاتیان لێ حەرامە هەروەك لە پێغەمبەر حەرام بوو ، وە لەبەر ئەوەی لە بیت المال بەشیان هەبووە ، هەروەك لە فەرمودە هاتووە: ( إن الصدقة لا تنبغي لمحمد ولا لآل محمد، إنما هي أوساخ الناس ( وفي رواية ) :وإنها لا تحل لمحمد ولا لآل محمد .(رواه مسلم .) زەكات دروست نییە بۆ پێغەمبەر و كەس وكارەكی پێغەمبەر ،بەراستی پیسی مالی خەلكە .

بەلام ئەمرۆ ئەوە نەماوە وە لە بیت المال بەشیان نییە ،ئەگەر هەژار بوون دروستە زەكاتیان بدرێتێ.

٤- كافر : كافر نایدرێتی چونكە زەكات تایبەتە بە موسلمانان .بەلام دروستە خێر و سەدەقەی سوننەتی بدرێتێ .

٥- وە ئەوكەسەی زەكات دەر بە خێو كردنی لە ئەستۆیەتی: وە كور و كچ و باوك و دایك و ژن .

دروست نیە ،پیاو زەكاتی بداتە دایك و باوكی ،وە كور و كچی كە لە ماڵەوە بە خێویان دەكات ،چونكە ئەوانە نەفەقەیان واجبە لەسەری .

هەروەها دروست نییە پیاو زەكاتی بداتە خێزانی خۆی چونكە نەفەقەی واجبە لە سەر مێردی ، بەلام دروستە لە مەزهەبی شافعی ئەگەر پیاو هەژار بوو ،ژنەكەی زەكاتی بداتێ بەبەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر كە بە زەینەبی فەرموو خێزانی عەبدوڵلای كوری مەسعود: «زوجك وولدك أحق من تصدقت به عليهم» أخرجه البخاری.

واتە : مێردەكەت و منداڵەكانت لەهەموو كەس شایستەترن لە وانەی زەكاتیان دەدەیتێ .

**تێبینی :**

_ دروستە كور زەكات بداتە باوكی یان باوك زەكات بداتە كوری ئەگەر لەبەر قەرزداری بوو، یان موجاهد بوو ،بەلام تەنها لەبەر بەخێو كردن دروست نییە زەكاتیان بدەنێ .نەوەوی لە مجموع ئاماژەی پێكردووە .

ئەوانە: ئەو (پێنج تاقمە) بە ناوی هەژار و نەدار زەكاتیان نادرێتێ (دروستە خێر و سەدەقەو دیاریان بدرێتێ) .

**بەرێزان**

بەوەندە كۆتایی پێ دەینم بۆ ئەوەی زۆر درێژ نەبتەوە وە مەسەلە وردەكان بۆ پەرتووكی تایبەت هەڵدەگرین ،وە با زۆر لە مەتنەكە دوور نەكەوینەوە ،وە ئەوەی زۆر گرنگە دەولەمەند و مامۆستای ئایینی بیزانن ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە :

(إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَرْضَ بِحُكْمِ نَبِيّ وَلَا غَيْرِهِ فِي الصَّدَقَاتِ، حَتَّى حَكَمَ فِيهَا هُوَ،

**فَجَزَّأَهَا ثَمَانِيَةَ أَجْزَاءٍ) رواه أبو داود.**

**واتە: بەراستی خودای بەرزو بالا لە حوکمی زەکاتەکان ، رازی نەبووە بەبریاری پێغەمبەر و هیچ کەسێکی تر ،تا بەخۆی حوکمی تێدا کرد ،وە کردی بە هەشت بەش.**

**بۆیە زۆر وردە مەسەلە هەیە لە زەکات ، دەبێت وریابین لە قسەکردن لە بارەیەوە ؟؟؟**

**واخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين**

**مەلا محمود محمد مجيد**

**مزگەوتی کۆمەڵگای گەلالە**

**١٨ی رەمەزانی ١٤٤١**

